١٠

زنجیرە وتاری (شیرك و شیرکی گوێڕایەڵی کردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## انصار الطواغيت بالسلاح

## سەرخەرانی تاغوتان بە چەك


وتاری شیخ

أبو علي الأنباري

تقبله الله



وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (دەیەم)

بەناونیشانی
سەرخەرانی تاغوتان بە چەك

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

تەواو بووین لە قسەکردن دەربارەی ئەو حکومەتانەی زانیمان کە ناوی شەرعی بۆیان بریتییە لە حکومەتە تاغوتییەکان، ئەمڕۆش بە ئیزنی الله تعالى قسەمان دەربارەی سەرخەرانی تاغوتان دەبێت، وە سەرخەرانی تاغوتانیش -هەروەك دەزانن- دابەش دەبن بۆ دوو بەش:

بەشێکیان سەریان دەخەن بە چەك -تاغوتان سەردەخەن بە چەك- کە هەردوو وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ دەچێتە نێو ئەم بەشە بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە بەبێ جیاکردنەوە و ئەوانەشی یارمەتیان دەدەن، وە بە هەمان شێوە -پەنا بە الله- ئەوەی کە ناسراوە بە صەحەوات ئەوانیش دەچنە نێو ئەم بەشەوە، وە ئەوەی ئێستاش کە ناسراوە بە حەشدی شەعبی، ئەوانە هەموویان پێیان دەوترێت: سەرخەرانی تاغوتان بە چەك، ئەمە چینی یەکەم.

چینی دووەم: سەرخەرانی تاغوتانن بە زمان، کە وەزارەتی ڕاگەیاندن دەچێتە نێو ئەم بەشە، هەر کەسێك شتێك بنوسێت یان بڵاوی بکاتەوە، یان وێنەیەك، هەر شتێك لەم بڵاوکراوانە لە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن (بینراو، خوێنراو، بیستراو) بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی ئەم حکومەتە تاغوتییانە، ئەوانەش بە سەرخەری تاغوتان بە زمان لە قەڵەم دەدرێن، لەگەڵ ئەوانەدا هەندێك لە وتاربێژەکانی مزگەوتەکانیش دەگرێتەوە ئەوانەی بانگەواز دەکەن بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی ئەو دەوڵەتە تاغوتییە کە ئەوانیش زۆرن لە هەموو وڵاتانی موسڵمانان هەن، کەوابوو وەزارەتی ڕاگەیاندن و هەندێك لە وتاربێژەکان بە سەرخەری تاغوتان بە زمان لە قەڵەم دەدرێن.

بە ویستی الله تعالی قسەمان دەست پێدەکەین دەربارەی سەرخەرانی تاغوتان بە چەك، حەقیقەتی ئەوانە چییە و حوکمی شەرع چییە لەبارەیانەوە؟

پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: ئایەتێك هەیە لە پەڕتوکی الله تعالی دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّـٰغُوتِ فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَـٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ۝٧٦﴾[1] ، واتە: ئەوانەی ئیماندارن لە پێناوی الله دا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی تاغوت دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

ئەو بابەت و مەسەلانەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەخۆی گرتووە: یەکەمیان: ئەوەیە کە الله عز وجل باسی دوو دەستە دەکات، وە باسی کاری هەر دەستەیەك لەم دوو دەستەیەی کردووە، پاشان دوای ئەوە باسی مەبەست و ئامانج لە کاری هەر یەك لەم دوو دەستەیەی کردووە، پاشان باسی حوکمی هەر دەستەیەکی کردووە لەم ئایەتەدا، پاشان باسی پەیوەندی نێوان دەستەی یەکەم و دەستەی دووەم دەکات، دواتریش باسی سەرەنجامی هەر دەستەیەك لەم دوو دەستەیەی کردووە، ئەم قسانە هەمووی لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا، درێژە و وردەکارییەکە چییە ؟

وتمان الله تعالی باسی دوو دەستەی کردووە لەم ئایەتە پیرۆزە: دەستەی یەکەم کە بەم شێوەیە لە سەرەتای ئایەتەکە الله عز وجل دەربارەیان دەفەرموێت (ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ) کەوایە ئەمە بریتییە لە دەستەی یەکەم، دەستەی دووەم، فەرمووی (وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّـٰغُوتِ) کەوایە ئەمەش بریتییە لە دەستەی دووەم.

**بابەتی یەکەم** :لە سەرەتادا لە لای دەستەی یەکەم دەوەستین، الله تعالی دەربارەی ئەم دەستەیە فەرمووی (ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟) لێرەدا مەبەست چییە لە ئیمان، وە چی شتێك دەچێتە نێو بازنەی ئیمان لەم ئایەتەدا، وە کێ دەبێتە یەکێك لە ئەهلی ئەم ئایەتە؟ مەبەست لە (ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟) : ئەو کەسەی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەیە لە بیروباوەڕ، وە مەبەست لەمەش ئەوەیە کە موسڵمان باوەڕی وابێت ئیمان بریتییە لە وتە و کردار، جا بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە ئیمان تەنها کورت نابێتەوە بە تەنها لە وتە بە زمان و بەڕاستدانان بە دڵ، بەڵکو لە پاڵ ئەمانەش بە کردار، چونکە کردار لە پێکهاتەی ئیمانە لە لای ئەهلی سوننە و جەماعە.

کاتێك ئەم قسەیە دەکەین مورجیئە دەیخەنە دەرەوە لە پێکهاتەی ئەم ئایەتە چونکە ئەوان باوەڕیان وایە

(١)النساء: ٧٦

کردار لە نێو پێکهاتەی ئیمان نیە، بەڵکو پێیان وایە کردار بە ڕەهایی لە مەرجەکانی تەواویەتی ئیمانە (کمال الإیمان) ؛ واتە ئینسان کە بە زمانی وتی "لا إله إلا الله" و لە دڵیشیدا ئەمەی بەڕاستدانا دوای ئەوە گرنگ نیە کردار دەکات یان نایکات، ئەگەر کرداری ئەنجامدا ئەوا ئیمانی تەواو دەکات، وە ئەگەر کردار ئەنجام نەدات ئیمانی کەم دەکات بەڵام هیچ کەسێك دەرناکەن لە دین بەهۆی وازهێنان لە کردار و کردەوە چونکە کردار لە پێکهاتەی ئیمان نیە لە لای موڕجیئە.

سەبارەت بە خەواریجیش پێچەوانەی ئەمەن، هەر کەسێك هەر شتێك وازلێبێنێت لە کار و کردەوەکان جا یەکسانە لەو کردارانە بێت کە کەمالی موستەحەب یان کەمالی واجبە یان لە بنچینەی ئیمان بێت ئەوا دەری دەکەن لە دین و تەکفیری دەکەن، بەڵام ئەهلی سوننە نە لەوانن و نە لەمانەش، ئیمان لە لایان وتەیە، لەمە تەواوبووین، بەڵام کاتێك دێنە سەر کردار ئەوا کردار دابەش دەکەن بۆ سێ بەش: هەندێك کردار و کردەوە هەیە لە ئیماندا خۆشویستراوە (المستحب) یان تەواوکەری خۆشویستراوە (کمال المستحب) -کردارە خۆشویستراوەکان لە کەمالی ئیمانن- وە هەروەها کردارە واجبەکان، ئەگەر ئەنجامت دا بە هەمان شێوە دەچێتە نێو کەمالی ئیمان، واتە ئیمان زیاد دەکات و ئیمان تەواو دەکات، چینی سێیەم هەیە لە کردارەکان دەچێتە نێو بنچینەی ئیمان بەجۆرێك ئەگەر شتێك وازلێبێنی لە بنچینەی ئیمان ئینسان دەردەچێت لە دین، وە ئەگەر شتێکی کرد کە لە بنچینەی ئیمان نەبێت بە هەمان شێوە لە دین دەردەچێت، کەوابوو ئیمان بریتییە لە وتە و کردار، جا فەرموودەی الله عز وجل (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ) مەبەستی ئەوانەیە (واتە ئەهلی سوننە)، الله عز وجل باسی کرداری ئەم دەستەیەی کردووە، تەبعەن لەگەڵ ئەمەشدا نابێت شیرکی پاڕانەوەی هەبێت، جا هەر کەسێك شیرکی پاڕانەوەی هەبێت لە پێکهاتەی ئەم ئایەتە نیە (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ) هەروەها ئەوەی شیرکی گوێڕایەڵی کردنی هەبێت بە هەمان شێوە ئەمەش لە پێکهاتەی ئایەتەکە نیە.

[یەکێك لە قوتابیەکانی پرسیاری لێ دەکات: شێخی بەڕێزمان واتە خەواریج لە چوارچێوەی ئەم ئایەتە نین؟ ]

شێخیش وەڵام دەداتەوە: نەخێر، خەواریج تەنها سێ لە زانایان تەکفیریان کردوون، موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی خەواریج موسڵمانن بەڵام ستەمکار و زۆردارن، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب تەکفیری نەکردن، تەنها (ابن العربي) و دوو لە زانایانی تر تەکفیریان کردوون، بەڵام زانایانی تر کۆڕان لەسەر ئەوەی خەواریج موسڵمانن، بەڵێ، هەر بۆیەش کاتێك جەنگیان لەگەڵ کردن لەسەر ئەوە بوون کە جەنگی ستەمکار و زۆردارەکان دەکەن نەك جەنگی موڕتەدان.

کەوایە (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ) زانیتان مەبەست لێی چییە و کێ دەچێتە نێو فەرموودەی الله عز وجل (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ) ئەو کەسەی دەڵێت ئیمان وتە و کردارە، وە هیچ شتێکی تیادا نیە لە شیرکی پاڕانەوە و هیچ شتێکی تیادا نیە لە شیرکی گوێڕایەڵی کردن یان خۆشویستن یان ویست و مەبەست، ئەمە بابەتی یەکەم.

**بابەتی دووەم:** کاری ئەم دەستەیە لە ئیمانداران ئەوەیە کە ئەوان جەنگاوەرن (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ) ئەگەر کەسێك لە ئیمانداران بێت بەپێی ئەو وەسفەی باسم کرد -وتە و کردار و هیچ شیرکێکی نەبێت- بەڵام نەجەنگێت، ئەمە ناچێتە نێو چوارچێوەی ئەم ئایەتە، وە تۆ دەزانیت کە ئینسان خۆی دابنێت لەبەردەم پەڕتوکی الله عز وجل، کاتێك دەیخوێنیتەوە لە خۆت بپرسە من لە کوێم لەم ئایەتە و ئەم ئایەتەش لە کوێیە سەبارەت بە من، الله عز وجل کاتێك دەفەرموێت (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ) بۆیە ئەوەی جەنگاوەر نەبێت ئەوا لە چوارچێوەی ئەهلی ئەم ئایەتە نیە، وە لێرەدا جەنگکردنیش الله عز وجل ئامانج لە جەنگکردنەکەیانی ڕوون کردۆتەوە، کەوابوو ئەوان ئیماندارن سیفەتیان ئەوەیە دەجەنگن بەڵام ئامانج لە جەنگەکەیان ئەوەیە دەجەنگن لە پێناو الله، هیچ مەبەست و ئامانجێکیان نیە لە جەنگکردن تەنها ئەوەی لە پێناو الله ـیە چونکە الله عز وجل باسی ئەم ئامانجەی کردووە لەم ئایەتەدا، مانای (يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ) چییە؟ فەرموودەیەك کە ئەبی موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە وەك لە لای ئیمامی بوخاری -رحمه الله- هاتووە، دەڵێت: "پیاوێك هات بۆ لای رسول الله (ﷺ) گوتی: پیاوێك دەجەنگێت بۆ غەنیمەت و دەستکەوت، پیاوێك دەجەنگێت بۆ ئەوەی باس بکرێت، پیاوێك دەجەنگێت بۆ ئەوەی شوێنەکەی خۆی ببینێت، جا کامیان لە پێناو الله ـیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی وشە و دینی الله بەرز بێت ئەوەیان لە پێناو الله ـیە" ڕیوایەتێکی تر هەیە لە لای ئیمامی موسلیم و ڕیوایەتێکی تریش لە لای ئیمامی بوخاری دەڵێت (ئازایەتی، دەمارگیری، و هاوشێوەی ئەمانە)، کەوابوو ئامانج لە جەنگکردنەکە لە لای ئەم دەستە ئیمانداره بریتییە لەوەی ئەوان دەجەنگن بۆ ئەوەی دینی الله بەرز و بڵند بێت (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ) ئەم دەستەیە، هەر کەسێکیش نەجەنگێت ناچێتە نێو ئەم دەستەیە، کاتێك باسی کۆمەڵی ڕزگاربوو (الفرقة الناجية) و کۆمەڵی سەرکەوتوو (الفرقة المنصورة) و هاوشێوەی ئەمانە دەکەی، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە کۆمەڵی ڕزگاربووە، تەنانەت حیزبی عێراقی بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە کۆمەڵی ڕزگاربووە، موڕجیئە بانگەشەی ئەوە دەکات لە کۆمەڵی ڕزگاربووە، چونکە هەندێك ئایەتیان وەرگرتووە و هەندێك فەرموودەیان وەرگرتووە بەڵام جیاکەرەوە لە نێوان کۆمەڵی ڕزگاربوو و ئەوانەدا: جەنگکردنە، بەڵگەی ئەمەش هەروەك لە لای ئیمامی موسلیم -رحمه الله- هاتووە دەڵێت: رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: "لا

تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة" واتە: بەردەوام كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم دەجەنگن لەسەر حەق ئاشكرا و دیارن تاوەكو ڕۆژی قیامەت. كەواتە مەبەست لەم كۆمەڵەیە كە دەمێنێت تاوەكو هەڵسانی قیامەت ئەو كۆمەڵەیەیە كە سیفەتی بنەڕەتی ئەوەیە جەنگاوەرە، لە غەیری صەحیحی موسلیم باسی جەنگكردن نەكراوە تەنها لە لای ئیمامی موسلیم نەبێت، سەبارەت بەم كۆمەڵەیە لە غەیری صەحیحی موسلیم بەم شێوەیە هاتووە (لا تزال طائفة من أمتي) بەڵام پێغەمبەر ﷺ باسی جەنگكردنی نەكردووە، فەرموودەیەكی تر هەیە بە هەمان شێوە لە صەحیحی موسلیم هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "لا تزال عصابة من أمتي يقاتلون على أمر الله قاهرين لعدوهم لا يضرهم من خالفهم حتى تأتيهم الساعة وهم على ذلك"، واتە: بەردەوام كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم لەسەر فەرمانی الله دەجەنگن دوژمنیان دەبەزێنن و نەیارانیان ناتوانن زیانیان لێبدەن تاوەكو قیامەت دێت و ئەوان هەر لەسەر ئەو بارە دەبن. كەوایە لێرەوە تێدەگەم كە ئەم كۆمەڵەیە دەمێنێت تاوەكو هەڵسانی قیامەت، وە دەجەنگێت جا خەڵك سەریان بخەن یان پشتیان تێبكەن ئەمە گرنگ نیە بەلایانەوە، وە هەمیشە دەیانبینی ئاشكرا و دیارن لەسەر حەق، ئەوان لەگەڵ حەقن و بە هەمان شێوە دەبینی حەق لەگەڵ ئەوانە، كەواتە ئەم دەستەی یەكەمە كە الله عز وجل باسی كردووە لەم ئایەتە ئەمە سیفەتەكانیان بوو.

وە ئاماژە دەكەم بۆ باسێكی گرنگ پەیوەستە بە ئایەتەكە: ئەویش بریتییە لەوەی كە الله عز وجل شایەدی دا بۆ ئەوانە بە ئیمان، فەرمووی (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ) بۆیە هەر كەسێك چەك هەڵبگرێت و بجەنگێت بۆ ئەوەی دین و شەریعەتی الله بەرز بێت بەپێی ئەم ئایەتە، الله عز وجل شایەدی بۆ دەدات بە ئیمان چونكە هیچ كەسێك ناجەنگێت لە پێناو بەرزكردنەوەی دین و شەریعەتی الله تەنها ئەو كەسە نەبێت كە هەڵوەشێنەرەوەكانی تیادا نیە و مەرجەكانی لا إله إلا الله ـی بەجێهێناوە، بەڵام هەر كەسێك هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەكانی تیادا بێت ناكرێت بجەنگێت بۆ ئەوەی دینی الله عز وجل سەربخات و هەتا دین و بەرنامەی الله بەرز بێت، دەشێت سۆفییەكان ماوەیەك چەك هەڵبگرن، ئەوانە ناجەنگن لە پێناو الله بە بەڵگەی ئەوەی ئەگەر الله عز وجل دەسەڵاتداریان بكات -خوانەخواستە- لە ناوچەیەك لە ناوچەكان دەبینی كە مەزارگەكان زۆر دەبن لەو خاكە، وە شیركەكان بڵاو دەبنەوە، وە پەیمانگا و قوتابخانە دەكەنەوە بۆ ئەوەی خەڵك فێری شیركەكان بكەن، كەوایە ئەوان ناجەنگن لە پێناو الله بۆ ئەوەی دینی الله بەرز و بڵند بێت، هەروەها حیزبی عێراقی ئەگەر بیر لەمە بكەنەوە یان ئیخوانی میصر ئەگەر بیری لێ بكەنەوە لە ڕۆژێك لە ڕۆژەكان چەك هەڵبگرن ئەوا هەڵیناگرن بۆ ئەوەی دین و

شەریعەتی الله بەرز بێت، وە دیمەن و ڕووداوەکانیش ئاشکرایە لەبەرچاوت لە میصر، کە چوار هەزار پیاویان لێ کوژرا لە یەك ڕۆژ لە چاوتروکاندنێکدا بەڵام لە پێناو دیموکراسی و لە پێناو گەڕانەوەی شەرعیەت -وە لێرەدا مەبەستیان لە شەرعیەت- ئەوەیە کە مورسی بە ڕێگەیەکی دیموکراسی هەڵبژێردراوە و شەرعیشە، جا لەسەریانە مورسی بگەڕێننەوە بۆ حوکم چونکە ئەمە ڕێگای شەرعییە لە حوکمدا، کەوایە ئەگەر چەکیش هەڵبگرن لە ئەهلی ئەم ئایەتە نین چونکە ناجەنگن لە پێناو الله هەتا دین و حوکمی الله بەرز بێت، سەبارەت بە هۆکاری ئاماژەپێکردنم بۆ ئەم فیرقە و کۆمەڵانە زۆربەی جار دەمەوێت تەنها لێك جیا بکەیتەوە تۆ لە کوێی ئەوانە دای، کەوابوو ئەمە دەستەی یەکەم.

دێینە سەر دەستەی دووەم، الله تعالى لەبارەیان دەفەرموێت (**وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ**) کەوایە بە هەمان شێوە دەستەی دووەمیش دەستەیەکی جەنگاوەرە -واتە هەڵگری چەکە یان پشتیوانی هەڵگرانی چەکە- (**وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ**) بەڵام الله عز وجل باسی ئامانج لە جەنگکردنەکەیانی کردووە جا فەرمووی (**يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ**) دوێنێ زانیمان ئەم حکومەتە مورتەدانە کە حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە حکومەتی تاغوتیین، دوو موسڵمان ناکۆکیان نیە لەمەدا بە بەڵگەی فەرموودەی الله عز وجل﴿**يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ** ﴿٦٠﴾﴾[1]وە بە بەڵگەی تێگەیشتنی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە وەك ئیبن قەییم -رحمه الله- لە (إعلام الموقعين) کاتێك وتی: "وە تاغوتی هەموو گەلێك ئەوەیە کە حوکم دەبنەوە بۆ لای جگە لە الله و پێغەمبەرەکەی"، وە بە بەڵگەی تێگەیشتنی موجاهید -رحمه الله- کاتێك وتی: "تاغوت شەیتانێکە لە شێوەی ئینسان، حوکم دەبەنەوە بۆ لای..."، وە هەروەها تەفسیری ئیمام مالیك هەروەك قورتوبی -رحمه الله- نەقڵی کردووە، جا ئەمە زانایانی ئەهلی سوننە ئەو کەسەی حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە الله دایبەزاندووە خستویانەتە ژێر ناوی تاغوت، ئەمە جیاوازییان لێی نیە، جا ئەگەر بێینە لای ئایەتەکە الله عز وجل دەفەرموێت (**وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ**) واتە لە پێناو ئەو حکومەتانە بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی لە وڵاتدا و بۆ ئەوەی بەرنامە و دینی تاغوت بەرز بێت، چۆن تێبگەم لە جەنگکردن لە پێناو تاغوت؟ (**وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ**) لێرەدا مانای لە پێناو تاغوت چییە؟ لە پێناو الله ئەمەیان تێگەیشتم، هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی دین و بەرنامەی الله بەرز بێت ئەوە لە پێناو الله ـیە، لە ڕێگەی فەرموودەی رسول الله (ﷺ) تێدەگەم کە واتای جەنگکردن لە پێناو تاغوت چییە، بەم شێوەیە دەبێت "هەر کەسێك بجەنگێت بۆ

---

(١)النساء: ٦٠

ئەوەی دین و بەرنامەی الله بەرز بێت ئەوە لە پێناو الله ـیە" کەواتە: هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی دین و بەرنامەی تاغوت بەرز بێت ئەوە لە پێناو تاغوتە، وە بەدڵنیاییەوە مەبەست لە پێناو تاغوت و وشەی تاغوت ئەم لێدوانانە نین کە لە کەناڵە ئاسمانیەکان دەیدەن بەڵکو مەبەست لە وشەی تاغوت: قانون و دەستورە، چونکە تاغوت کەسێکە دەڕوات و نامێنێت بەڵام دەستور و قانون دەمێنن، وە وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ هەرچەند لێیان بکوژرێت ئەوا ئەو دوو وەزارەتە هەر دەمێنن، وە ئەندامانی ئەو دوو وەزارەتە هەمیشە دەجەنگن بۆ ئەوەی دین و بەرنامەی تاغوت بەرز بێت، کەوایە بەدڵنیاییەوە ئەوان دەجەنگن بۆ بەرزکردنەوەی دەستور و بەرزکردنەوەی قانون هەتا حوکمی بەندەکان و وڵات بەم قانونانە و بەم دەستورانە بکرێت.

باشە، الله تعالی لە وەسفی ئەوانە فەرمووی (وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ) باسی حوکمەکەی کردووە پێش کار و پێش کردەوەکە، بۆچی الله عز وجل نەیفەرموو: والذين يقاتلون في سبيل الطاغوت کفار، وە ئەوانەی دەجەنگن لە پێناو تاغوت کافرن؟ بۆچی فەرمووی (وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ) بۆچی حوکمەکەی پێش کارەکە خستووە؟ چونکە قورئان بە زمانی عەرەب دابەزیوە و عەرەبیش هەمیشە ئەگەر بیانەوێت گرنگی بدەن بە شتێك پێشیدەخەن بۆ سەرەتا، ئەمە شێوازەکانی عەرەبە لە گەیاندنی چەمکەکان ئەگەر بڵێم -بۆ نموونە- ذهب أحمد إلى السوق، کەسی عەرەبی تێدەگات کە من گرینگیدانەکەم داوە بە (الذهاب - ڕۆیشتنەکە) چونکە باسی (الذهاب)ـم کرد لە سەرەتادا، بەڵام ئەگەر بڵێم: إلى السوق ذهب أحمد ئەمە مانای ئەوەیە من گرینگیم داوە بە (السوق - بازاڕەکە) چونکە باسم کرد لە سەرەتادا، بەڵام ئەگەر بڵێم: أحمد ذهب إلى السوق، ئەوا گرینگیەکەم داوە بە أحمد، کەوایە لە زمانی عەرەبی بەم شێوەیە باسی گرینگتر پاشان گرینگ دەکەن، وە پەڕتوکی پەروەردگارمان بە زمانی عەرەب دابەزیوە و گرینگترین شتیش لەم ئایەتە کە پەیوەستە بە سەرخەرانی تاغوتان بریتییە لە حوکمەکەیان، هەر بۆیەش الله عز وجل حوکمەکەی پێشی کارەکە خستووە لە لایەنی ئاگادارکردنەوە و لە لایەنی ورياكردنەوە و لە لایەنی سەرزەنشتکردنەوە و لە لایەنی ڕێگریکردنەوە (وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ) بۆیە کاتێك زانیتان کە هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی دین و بەرنامەی تاغوت بەرز و بڵند بێت -قانون و دەستور- ئەوا الله عز وجل حوکمی داوە لەسەری بە کوفر، واتە ئەم تەکفیرکردنە لە ئینسانەوە نیە، ئەمە تەکفیرێکی خواییە لە ڕێگەی وەحی لە پەڕتوکی الله عز وجل، جا کاتێك دەڵێم وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ و حەشد و صەحوە موڕتەدن، من حوکمم نەداوە بەڵکو حوکمێك نەقڵ دەکەم کە الله عز وجل داویەتی لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە، وە ناکرێت قسە بوترێت بەو کەسەی نەقڵی دەکات، باشە، ئەگەر

زانیهان کە ئەوانە کافرن -وەك گونجاندنێك بۆ مورجیئە پیسەکان- ئایا ئەمە کوفری گەورەی دەرچوێنەرە لە دین، یان کوفری بچووکە و (کفر دون کفر)ـە هەروەك ئەو خۆشەویستانەی تاغوتان دەستیان پێوە گرتووە؟

ئەم کوفرەی باسکراوە لێرەدا کوفری گەورەی لە دین دەرچوێنەرە، وە بەڵگەش لەسەر ئەمە:

یەکەم: الله عز وجل دەربارەی ئەو دەستەیە فەرمووی دەجەنگێت لە پێناوی تاغوت، وە مانای جەنگان لە پێناو تاغوتت زانی، واتە ئەو چەکی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی بەندەکان و وڵات بە قانون و دەستور حوکمی پێبکرێت، ئەمە هیچ کەسێك ناکۆکی لێ نیە و ئەمەش عیللەت و هۆکارێکی کوفرییە چونکە پیاو ئەگەر چەکی هەڵگرت، جیاوازی چییە لە نێوان ئەو موشریکەی لە سەردەمی رسول الله (ﷺ) دەجەنگا هەتا حوکم بکرێت بە حوکمە جاهیلییەکان لەگەڵ وەزارەتی بەرگری و صەحوە و حەشدی ئەمرۆ؟ هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوانیان، ئەوان دەجەنگان بۆ ئەوەی حوکم بکەن بە حوکمە جاهیلییەکان، ئەوانەش دەجەنگن هەتا حوکمی بەندەکان بکرێت -موسڵمانان بەتایبەت- بۆ ئەوەی حوکمیان بکرێت بە حوکمە جاهیلییەکان بۆیە ئەمە عیللەتێکی کوفرییە، ئەوەی دەجەنگێت لە پێناو تاغوت -کە زانیهان مانای تاغوت چییە- کەس ناکۆك نیە جگە لە مورجیئەیەکی پیس یان ئیخوانییێکی پیس لەوەی کە ئەوانە هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی الله عز وجل، ئەمە عیللەت و هۆکاری کوفریی یەکەم بوو.

عیللەت و هۆکاری کوفریی دووەم لە ئاماژەپێکردنی دەق تێدەگەین، وە ئاماژەی دەقیش هەروەك زانایانی ئوسوڵ پێناسەیان کردووە: "دلالة اللفظ على لازم غير مقصود من اللفظ، لا يتوقف عليه صدق الكلام ولا صحته" واتە: بەڵگەی دەربڕین و قسە لەسەر لازمێك کە مەبەست نیە لە قسەکەدا، ڕاستی و دروستی قسەکە ناوەستێت لەسەری. مانای ئەم قسەیە چییە؟ فەرموودەی الله تعالى﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ ٢٣٣﴾[١] واتە: دایکان (تەڵاقدراو بن یان نا) دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن. ئایەتەکە ئاشکرا و ڕوونە، لە ئایەتێکی تردا﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ ١٥﴾[٢] ، واتە: سك پڕبوون و لە شیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندوون. لە ماوەی کۆکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، ئاماژەی دەق پێت دەڵێت کە ئەگەر منداڵ لە شەش مانگی لە دایك بوو ئەوا لەدایك بوونەکەی بە شەرعی هەژمار دەکرێت، بە منداڵی زینا هەژمار ناکرێت لە هیچ بارێك لە بارەکان، بۆچی؟ چونکە (وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ

(١)البقرة: ٢٣٣

(٢)الأحقاف: ١٥

شَهۡرًاۚ) (وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ) سی کەم بیست و چوار (٣٠ - ٢٤) = شەش مانگ، بۆیە ئەگەر منداڵ بە شەش مانگ لەدایك بوو ئەم منداڵە بە شێوەیەکی شەرعی لەدایك بووە باوکەکەش ناتوانێت حاشا لە دانەپاڵی ئەم منداڵە بکات، ئەو قسەیەی کردم نە لە ئایەتی یەکەم هەیە نە لە ئایەتی دووەم، کەوایە لە کوێوە هێنامان، ئیبن عەباس لە کوێوە ئەم حوکمەی هێنا؟ زانایان دەڵێن ئەمە لە ئاماژەپێکردنی دەقە "دلالة اللفظ على لازم غير مقصود من اللفظ، لا يتوقف عليه صدق الكلام ولا صحته" واتە ئەگەر ئەم قسەیەشم نەکردایە ئایەتەکە هەر لەسەر ماناکەی خۆی دەمێنێتەوە و ئایەتی دووەمیش بە هەمان شێوە لەسەر ماناکەی خۆی دەمێنێتەوە، ئاماژەپێکردنی دەق لەم ئایەتەدا لە کوێیە (وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ) بە پێویست بوونەوە تێدەگەی کە ئەوانە دەجەنگن لەگەڵ دەستەی یەکەم کە الله دەربارەیان فەرمووی (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ) ناکرێت وا تێبگەین کە یەکێکیان ئەوی تر دەکوژێت (واتە دەستەی دووەم -کافران- هەندێکیان هەندێکی تریان بکوژن) وە ناکرێت وا تێبگەین کە ئەوان دەجەنگن لەگەڵ کەسانێك بە هەمان شێوە دەیانەوێت تاغوت حوکم بکات و دەیانەوێت دین و بەرنامەی تاغوت بەرز بێت، بەڵکو دەجەنگن لەگەڵ ئەوانەی دەیانەوێت دین و بەرنامەی الله بەرز بێت، کەوابوو ئاماژەپێکردنی دەق پێمان دەڵێت کە ئەم دەستەیەی الله عز وجل حوکمی بەسەردا بە کافربوون بەدڵنیاییەوە دەجەنگن لەگەڵ دەستەی یەکەم کە دەجەنگێت لە پێناو الله، ئەمەش دەچێتە نێو بابەتی حەڵاڵ کردنی خوێنی حەڕام چونکە ئەوانە الله عز وجل شایەدی بۆ دان بە ئیمان، وە کارەکەیانی ڕوون کردەوە بەوەی ئەوان دەجەنگن، وە ئامانج لە جەنگکردنەکەیانی ڕوون کردەوە بۆ ئەوەی دین و حوکمی الله بەرز بێت، کەوایە ئەو خوێنانە حەڕام کراون، بەڵگەی ئەمەش فەرموودەیەك کە ئەبو هوڕەیرە (رضي الله عنه) گێڕاویەتییەوە هەروەك لە لای ئیمامی موسلیم -رحمه الله- هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "كل المسلم على المسلم حرام دمه وماله وعرضه" واتە: هەموو موسڵمانێك لە موسڵمان خوێن و سامانی و ناموسی لێی حەڕامە. ئەوانە موسڵمانن بە شایەدی الله، ئیماندارن و دەجەنگن لە پێناو الله، خوێنیان حەڕامە جا ئەو کەسەی کوشتنی ئەوانە حەڵاڵ بکات ئەوا ئەوەی حەڵاڵ کردووە کە الله عز وجل حەڕامی کردووە، وە تۆ دەزانیت ڕێساکە لە لای ئیمامی تەحاوی -رحمه الله- دەڵێت: "هیچ یەکێك لە موسڵمانان تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهێکەوە مادام بە حەڵاڵی نەزانێت" ڕشتنی خوێن ئەمە گوناهێکە دەشێت ئینسانێك ئینسانێکی تر بکوژێت ئەمە لە تاوان و سەرپێچییەکان هەژمار دەکرێت - لە گەورەکانە-، بەڵام ئەگەر وتی: خوێنی ئەم موسڵمانە حەڵاڵە ئەمە لە دین دەردەچێت، هەروەها ئەو فەرموودەیەی (أبو بكرة (رضي الله عنه)) گێڕاویەتییەوە کە لە لای ئیمامی بوخاری

هاتووە لە وتاری حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (إن دمائكم وأموالكم وأعراضكم بينكم حرام كحرمة يومكم هذا في شهركم هذا في بلدكم هذا) واتە: بەڕاستی خوێنتان و ماڵ و سامانتان و ناموستان حەڕامە لە نێوانتان وەك حەڕامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتان لەم شارەتان. ئەم خوێنانە حەڕام کراون، جا هەر کەسێك ئەم خوێنانە حەڵاڵ بکات ئەوا لە دین دەردەچێت، وە ئەوانە خوێنی ئەو کەسانەیان حەڵاڵ کردووە کە الله عز وجل شایەدی بۆ داون بە ئیمان و چەکیان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی دین و حوکمی الله بەرز بێت، ئەمە عیللەتی کوفریی دووەمە کە لە ئاماژەی دەق لێی تێدەگەین.

عیللەت و هۆکاری کوفریی سێیەمی ئەوانە: الله عز وجل لەبارەیانەوە دەفەرموێت (فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ) کەوایە عیللەتی کوفریی سێیەم ئەوەیە کە وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ و صەحەوات و حەشد ئەوانە دۆست و یاوەرانی شەیتانن، پەیوەندی شەیتان چییە بەم بابەتە، بۆچی الله عز وجل نەیفەرموو بجەنگن دژی دۆست و یاوەرانی تاغوت لە کاتێکدا دەقەکە دەربارەی تاغوتانە؟ والذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت فقاتلوا أولياء الطواغيت، بۆچی الله عز وجل وای نەفەرموو؟ پەیوەندی شەیتان چییە بەم بابەتەوە؟ الله عز وجل دەیەوێت بۆ ئەوانەی حوکمی بەسەردان بە کافربوون، عیللەتی سێیەم بچەسپێنێت: کە ئەوانە لە دۆستانی شەیتانن، چۆن دەیسەلمێنیت ئەوانە لە دۆستانی شەیتانن؟

یەکەم: لەبیرتە کاتێك وتمان ئەم قانون و دەستورانە وەحییە لە شەیتانەوە؟﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ ١٢١﴾[1] کەوابوو ئەم قانونە و ئەم دەستورە وەحییە لە شەیتانەوە، وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ و صەحەوات و حەشد دەجەنگن بۆ حوکم پێکردنی ئەم قانونانە و ئەم دەستورانە کە لە وەحی شەیتانەوەیە، کەوایە ئایا ئەوانە لە دۆست و یاوەرانی شەیتان نین؟ بەدڵنیاییەوە بەڵێ؛ چونکە مانای (الولي) لێرەدا : خۆشەویست سەرخەر هاوپەیمان ـە، وە ئەوانەش شەیتانیان خۆشدەوێت و شەیتانیش ئەوانی خۆشدەوێت هەر بۆیەش دەجەنگن بۆ بەرگری کردن لە قانون و دەستورێك کە شەیتان بە وەحی دەینێرێت بۆ دۆستەکانی، کەوابوو ئەوانەی دەجەنگن لە پێناوی تاغوت دۆست و یاوەری شەیتانن، ئەمە بەڵگەی یەکەم.

سەبارەت بە بەڵگەی تر: هەر کەسێك سەرپێچی شتێك لە شەرعی الله عز وجل بکات ئەوا گوێڕایەڵی شەیتانی کردووە، جا لە بابەتە گەورەکان بێت یان بچووکەکان، هەر سەرپێچی کردنێکی شەرعی الله عز وجل گوێڕایەڵی کردنی شەیتانە، بەڵگەی ئەمە: فەرموودەی الله عز وجل ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ

[1] الأنعام: ١٢١

وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾[1]واته: بەڕاستی الله فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاكەكاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزم و نزیكەكان و ڕێگری دەكات لە هەموو كارێكی دزێو و خراپە و ستەم و لەسنوور دەرچوون، ئامۆژگاریتان دەكات بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێبفكرن. الله عز وجل ڕێگری دەكات لە كارە دزێو و خراپەكان، لە لایەكی ترەوە هەروەك ئایەتەكە لە سوڕەتی (البقرة) هاتووە ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴿٢٦٨﴾﴾ كەوایە الله عز وجل ڕێگری و نەهی دەكات، شەیتان فەرمان دەكات، هەر بۆیە كاتێك سەیری نموونەیەك دەكەی لە ڕێگری كردن و فەرمان پێكردن: الله تعالى دەفەرموێت ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴿٢٦٨﴾﴾[2]، واتە: هەرگیز نەكەن نزیكی زینا بكەونەوە، چونكە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچكەیەكی زۆر ناقوڵا و خراپە. كەوایە فاحیشە، الله عز وجل ڕێگری لێ دەكات، زینا فاحیشەیە بۆیە الله عز وجل ڕێگری لە فاحیشە دەكات -لە زینا- شەیتانیش فەرمان دەكات بە زیناكردن چونكە زینا لە فاحیشەیە، كەوایە هەموو سەرپێچی كردنێكی فەرمانی الله عز وجل یاخود شەرعی الله تعالى ئەوا گوێڕایەڵی كردنی شەیتانە ئەمە بەڵگەی دووەم.

وە بەڵگەی تر، ئەوەی هاتووە لە سوڕەتی (الأنعام) لەبارەی پێغەمبەر ئیبراهیم درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت،﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٧٤﴾﴾ واتە: ئەو كاتە وەبیربێنە كە ئیبراهیم بە ئازەری باوكی وت: ئایا ڕاستە چەند بتێك بكەیتە خوا؟! بەڕاستی من دەبینم تۆش و قەومەكەشت لەناو گومڕاییەكی ئاشكرادان. ئەمە لە سوڕەتی (الأنعام)، وە لە سوڕەتی (الشعراء)﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾﴾ واتە: هەروەها بەسەرهات و هەواڵی ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵكە باس بكە * كاتێك بە باوكی و بە قەومەكەی وت: باشە، ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟! وتیان (ئاشكرایە) ئێمە كۆمەڵێك بت دەپەرستین و بەردەوام دەور و خولیان دەدەین. كەوایە لە ڕێگەی ئایەتەكەی (الأنعام) و ئایەتەكەی (الشعراء) بۆم چەسپا كە باوكی پێغەمبەر ئیبراهیم بتی دەپەرست، (وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ) وە ئەمەش بزانە كە ڕافیضە دان نانێن بەوەی باوكی پێغەمبەر ئیبراهیم ئازەرە -كەمێك لە بابەتەكە دەردەچین- چونكە مادام ئەمەمان باس كرد ئەوەش باس

(١)النحل: ٩٠

(٢)الإسراء: ٣٢

دەكەین بە هەمان شێوە، ڕافیضە قبوڵ ناكەن كە بڵێی دەربارەی باوكی پێغەمبەر ئیبراهیم ئازەر بڵێی ئەمە باوكیەتی، دەڵێن: ئەمە مامی ئەوە، ئەی كەوایە كێ باوكیەتی؟ دەڵێن: باوكی تارح ـە، ئایا دەزانی تارح ناوی باوكی پێغەمبەر ئیبراهیمە لە تەورات؟ لە كاتێكدا لە قورئان ئازەرە، جا ئەمە ناڵێن بەهۆی خۆشویستنی ئیبراهیم (ﷺ) یان باوكی یان مامی، بەڵكو لەبەرئەوەیە ئەگەر ئەوە قبوڵ بكەن كە باوكی ئیبراهیم دەچێتە نێو ئاگر ئەوا مانای وایە ئەبی تاڵیب ـیش دەچێتە نێو ئاگر، بەڵام ئەگەر مامی بێت، نەخێر، بابەتەكە جیاواز دەبێت، چەپەڵن، كەوابوو هەر كەسێك سەرپێچی شتێك لە حوكمەكانی الله عز وجل بكات ئەوا گوێڕایەڵی شەیتانی كردووە هەروەك لە سوڕەتی (الأنعام) باسی ئایەتەكەم كرد (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً) كەوایە بەدڵنیاییەوە باوكی ئیبراهیم بتی دەپەرست، لە كاتێكدا لە سوڕەتی (مریم) بەم شێوەیە﴿ يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ ﴾ ، واتە: ئەی باوكم شەیتان مەپەرستە، چونكە بەڕاستی شەیتان یاخی یە لە خوای بەخشندە و سەركەشیی كردووە.

من دەمەوێت بزانم كە ئایا بت دەپەرستێت یان شەیتان دەپەرستێت؟ ئەوەی تر دەقێكە لە لایەن الله تعالى ـەوە لەم ئایەتەدا، وە ئەمەش دەقێكە لە پەڕتوكی پەروەردگارمان لەم ئایەتەدا، لا تعبد الشيطان، أتتخذ أصناما آلهة، كەوایە بە پێویست بوونەوە تێدەگەم كە بەندایەتی كردن بۆ بت بەندایەتییەكی ڕاستەوخۆ بوو، بەڵام بەندایەتی كردنی ئەو بۆ شەیتان بەندایەتییەكی ناڕاستەوخۆ بوو چونكە ئەم بتەش تەنها بە ڕازاندنەوەی لە لایەن شەیتانەوە هەیە و دەپەرسترێت، (وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ) كەوایە وەزارەتی بەرگری و ناوەخۆ و صەحوە و حەشد ئەمانە هەموویان دۆست و یاوەرانی شەیتانن ئەمە سێ عیللەت و هۆكار بوو لەم ئایەتەدا لەبارەی ئەوەی كوفری ئەوانە كوفری گەورەیە دەرچوێنەرە لە دین.

ئایەتەكە تەواو دەكەین، پەیوەندی چییە لە نێوان دەستەی یەكەم - الَّذِينَ آمَنُوا- و دەستەی دووەم - وَالَّذِينَ كَفَرُوا -؟ ، پەیوەندییەكە پەیوەندی جەنگكردنە، وە فەرمانكردنەكەش بە جەنگكردن لە لایەن الله ـەوە - عز وجل- دەرچووە، فەرمانكردنەكە بە جەنگ لە لایەن ئینسانەوە نیە، ئەمە فەرمانێكە لە لایەن الله تعالى ـەوە هەر ئەوە كە فەرموویەتی (الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا ) ئەم فەرمانە ئاڕاستەی كێ كراوە؟ بۆ دەستەی یەكەمە ئەوانەی الله لەبارەیانەوە فەرمووی (الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ) بۆ ئەوانە الله تعالى دەفەرموێت (فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ) بۆیە فەرمانكردن بە جەنگان لەگەڵ سەرباز و پۆلیس و صەحوە و حەشد ئەمە لە لایەن الله ـوەیە -عز وجل- نەك لە ئینسانەوە، وە ئەم فەرمانەش ئاڕاستەی هەر كەسێكە باوەڕی هێنابێت بەم پەڕتوكە، هەر كەسێك باوەڕی

هێنابێت بە پەڕتوکی الله عز وجل ئەوا الله تعالی فەرمانی پێکردووە لە دەستەی ئیمانداران بێت ئەوانەی دەجەنگن لە پێناو الله، وە بجەنگێت لەگەڵ ئەو دەستە کافرەی دەجەنگێت لە پێناو تاغوت و ئەوانەی کە دۆستی شەیتانن، ئینجا ئەگەر کەسانێك بێن و بڵێن: خوێنی کەسی عێراقی حەڕامە -هەروەك پەرلەمان داینا لە خولی پێشووی یاخود بەر لە پێشووی- تەشریعێکیان دەرچواند کە خوێنی کەسی عێراقی حەڕام دەکات، وە الله عز وجل دەفەرموێت (فَقَٰتِلُوٓاْ) وە ئەم تەشریعەش -بابەتی حەڕام کردنی خوێن بەگوێرەی ئارەزوو و هەوەس- هەمیشە سەرچاوەکەی ئەو پیسانەن ئیخوانی میصرِ؛ چونکە لە فەڵەستین بە هەمان شێوە بڕیارێکیان دەرکرد ناویان لێنا حەڕام کردنی خوێنی کەسی فەڵەستینی، هەر بۆیەش دەبینی پارچە سیخوڕییەکان لە سەیارەکانیان دادەنرێت و ڕۆژێك نەمانبیست کە فەڵەستینیێك بکوژرێت بەهۆی ئەوەی یارمەتی و هاوکاری جوولەکەی کردووە لە دژی فەڵەستینییەکان، هەرگیز گوێبیست نەبوینە بۆچی؟ چونکە خوێنی فەڵەستینی حەڕامە! تەنانەت ئەگەر سەرکردەکانیان بکوژێت و فەرماندەکانیان بکوژێت و پارچە سیخوڕییەکان دابنێت لە کارگەکانیان گرینگ نیە بەلایانەوە، بۆچی؟ چونکە خوێنی فەڵەستینی حەڕامە، وە هەر ئەمە بوو کردیان لە عێراق کاتێك وتیان: حەڕامە خوێنی کەسی عێراقی حەڕامە، وە الله عز وجل دەفەرموێت (فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ) بۆیە هەر کەسێك بڵێت کە ئەوەی سەربازە نابێت جەنگی لەگەڵ بکرێت و پۆلیس نابێت جەنگی لەگەڵ بکرێت و صەحوەچی نابێت جەنگی لەگەڵ بکرێت و حەشداوی نابێت جەنگی لەگەڵ بکرێت ئەم قسەیەیان پێچەوانەی فەرمانی الله ـیە -عز وجل- کە فەرموویەتی (فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ ) وە هەر کەسێك بڵێت ئەوان موسڵمانن، دەڵێین: ئەمە قسەی خۆتە بەڵام وتەی پەروەردگارمان عز وجل ئەوەیە کە تەکفیری کردوون لە قورئانی پیرۆز فەرمووی (وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ) دوای ئەوە گرینگ نیە بەلامەوە کە لەو کەسانە بێت هاتووچۆی مزگەوت دەکەن و لەوانە بێت کە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبن و لەوانە بێت کە حەج دەکەن و قورئان دەخوێنن؛ چونکە ئەم کردەوانە هەموویان هیچ سوودێك ناگەیەنن ئەگەر لە دین دەرچوو، وە تۆش دەزانیت کە (الصِّديق ﷺ) لەگەڵ کەسانێك جەنگا کە تەنها ڕەتیان کردەوە زەکات بدەن، شایەدیان دەدا بە (لا إله إلا الله) و نوێژیان دەکرد و ڕوکنەکانی تریشیان بەجێدەهێنا، بەڵام تەنها زەکاتیان نەدەدا، جا لەگەڵیان جەنگا لەسەر ئەوەی ئەوان مورتەدن و ئەمەش ئیجماعی صەحابەیە ڕەزای الله لە هەموویان بێت، کەوایە دەچینە نێو ئیسلام لە هەموو دەرگاکانیەوە بەڵام دەشێت ئینسان لە یەك دەرگا دەربچێت جا ئەگەر دەرچوو لە یەك دەرگا ئەو کاتە دەرگاکانی تر سوودی بۆی نابێت کە تیایدا دەمێنێتەوە جا یەکسانە نوێژ بکات یان هاوشێوەی ئەمانە.

[یەکێك لە قوتابیەکان پرسیارێکی لێ دەکات بەڵام دەنگەکە ڕوون نیە] شێخیش -تقبله الله- دەڵێت: بەڵێ، ئەو موڕتەدەی هەڵگەڕانەوەکەی چڕە (مغلظة) ؛ چونکە دەشێت ئینسان لە دین دەربچێت بەبێ ئەوەی ئازاردەر بێت بۆ موسڵمانان یاخود بۆ ئیسلام، تەنها نوێژنەکەرە ئەمە هەڵگەڕانەوەیەکی مجردە تا سێ ڕۆژ داوای تەوبەی لێ دەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا دەکوژرێت، بەڵام ئەوەی لە ئیسلام دەردەچێت و دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان دەکات ئەمەیان هەڵگەڕانەوەکەی چڕە تەوبەکردنی وەردەگیرێت پێش ئەوەی دەسەڵات لەسەری هەبێت بەڵام ئەگەر الله عز وجل بەندەکانی خۆی توانادار کرد بەسەریدا و بکەوێتە دەستیان ئەوا هیچی بۆ نیە جگە لە کوشتن، نە فیدیەی بۆ دەدرێت نە ئازاد دەکرێت و ...، تەنها کوشتنی بۆ هەیە ئەمەش حوکمی موڕتەدی جەنگاوەرە.

کەوابوو الله عز وجل ئەوانەی تەکفیر کرد، وە باسی عیللەت و هۆکارەکانی تەکفیرکردنەکەم بۆ کردن، وە وتم کە الله فەرمانی کردووە بە دەستەی یەکەم بەوەی بجەنگن لەگەڵ دەستەی دووەم بۆیە هەر کەسێکیش بڵێت جەنگیان لەگەڵدا ناکرێت، ئەمە قسەی خۆیەتی، بەڵام وتەی پەروەردگارمان (**فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِ**).

مزگێنیەکەش لە کۆتایی ئایەتەکەیە: (**إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا** ) ئەمە مزگێنییە بۆ دەستەی یەکەم، چونکە ئەگەر هەستی کرد (واتە شەیتان) کە دۆستەکانی بە هەڵوێستێکی تەنگ و سەختدا تێدەپەڕن ئەوا بە خێرایی پشتیان تێدەکات، ﴿**نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٤٨**﴾[1]، واتە: دەستبەجێ شەیتان پاشە وپاش گەڕایەوە و وتی: بەڕاستی من بەریم لە ئێوە! چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، من لە الله دەترسم، وە الله زۆر سەخت و بە زەبرە لە تۆڵەدا.

(**إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا** ) بۆیە ئەگەر پیلان و تەڵەکەی شەیتان لاواز بێت، بەدڵنیاییەوە پیلانی ئەوانەی شەیتان دەیانکاتە دۆستی خۆیان و ئەوانیش شەیتان دەکەن بە دۆستی خۆیان زۆر لاوازترە هەر بۆیەش دەبینی -ئەمە قسەی من نیە بەڵکو قسەیەکە لە کەناڵە ئاسمانییەکان دەوترێت- کە صلاح الدین ئەم پارێزگایە، پارێزگای ئەهلی سوننە ڕادەستی موجاهیدان کرا، نەخێر ڕادەست نەکرا بەڵکو الله دەسەڵاتداری کردن بەسەریەوە لە نیو کاتژمێردا، ژمارەی سوپا و پۆلیس و صەحوە پەنجا هەزار بوو، ژمارەی ئەو گەنجانەی چوونە ناویەوە تەنها سێ سەد بوو (**إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا** ) پەنجا هەزار لە نیو کاتژمێردا و ژمارەی گەنجەکانیش کە چوونە ناویەوە سێ سەد بوو، وە هەروەها هەمان شت لە

---

(١)الأنفال: ٤٨

موصل لە پارێزگای نەینەوا و هەروەها لە زومار ولله الفضل والمنة، ئەم دەوروبەرە و ڕافیضە لە تەلەعفەر، کەوایە مزگێنیەکە لە کۆتایی ئایەتەکەدا (﴿إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ ) کەوابوو ئەوەی دەستمان دەکەوێت براکانم ئەی بەڕێزان، دەستەی یەکەمان ناسی و دەستی دووەمیشمان بە هەمان شێوە ناسی، کە الله عز وجل حوکمی دا بەسەریان بە کوفر، أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وتاری**

**شێخ ئەبی عەلی ئەنباری** - تقبه الله-

**بەناونیشانی**

**سەرخەرانی تاغوتان بە چەك**

**وەرگێڕانی**

**پێگەی ڕاستەڕێ**

